**لەجیاتی پێشەکی :**

**من دەمەوێ بە چەند ناونیشانێك لە بابەتەکە بدوێم :**

**فەرموودەکانی بوخاری ریوایەتی کردوون دەکرێ تاك تاکە لاوازبن ..**

**بوخاری لە دیدی موسڵمانان کەسێکی زۆر پیرۆزە ، بەڵام مەعسوم نیە لە هەڵە ، هەر بە وتەی خوای گەورە " ئەگەر ئێوە هەڵە نەکەن ، خوا ئوممەتێك دەهێنێت هەڵە بکەن ، تا لێیان ببورم ... " لە فەرموودەی پێغەمبەریش(ﷺ) هاتووە " هەموو مرۆڤەکان هەڵە دەکەن ، باشترینی هەڵەکاران تەوبەکارانن " .**

**لەو دوو پێنگەوەوە ، دەکرێ ئەوەی لە بوخاریدا هەیە ، گێڕەوەکانی لە هەندێ فەرمووده لەبەر تەمەن زۆری ، هەواڵەکە نەیگێرابێتەوە یان هەندێکی تر کەلتوری دوورگەی عەرەبی وای لە گێڕەوە کردبێ ، لە گێڕانەوەی ڕووداوێك سەرچیغ (سەهو) بچێت ، وەك تێوەگلانی حەسانی کوڕی سابت لە ڕووداوی ئیفك کە زاتی خوا دیفاعی لە پاکی عائیشە کرد .**

**من شایەنی ئەوە نیم کە قسە لەسەر پێشەوایەکی وەك بوخاری یان تەمەنی عائیشە بکەم کتێبی بوخاری و موسلیم کۆکەرەوەی زۆربەی فەرموودە دروستەکانی پێغەمبەرن(ﷺ) ، ئەو فەرموودانەی بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە بە پرۆسەی هەڵێنجان دەچنەوە ، چونکە ئەوانەی گێڕاویانەتەوە مرۆڤن ، بەواتای بە پرۆسەی لەبیرکردن (سەهو) دادەچن ، هەروەها ئەو فەرموودانە بە پێوەری قورئان دەپێورێن نابێ پێچەوانە و هەڤدژی قورئان بێت . وێڕای ئەو دوو هۆکارەش ئەلبانی لە کتێبی (سلسلة الاحادیث الضعیفة والموضوعة) چاپی دووەم ١٤٢٠-٢٠٠٠ ئەو فەرموودانەی بە ژمارە (١٨٢١لا٢٢٩ ، ١٩٠٢لا٣٧٥ ، ١٩١٢لا٣٨٥ ، ١٩٢٣لا٣٩٥) هاتوون بە فەرموودەی لاوازی داناون ، هەرچەندە ئەو فەرموودانە بوخاری ڕیوایەتی کردوون .**

**بوخاری و تەمەنی عائیشە ..**

**بە هیچ جۆرێ لە هەموو فەرمووده‌کانی نێو بوخاری نادوێم ، تەنها لە یەك فەرموودەی بوخاری دەدوێم کە باسی تەمەنی عائیشەی دایکمان دەکات .**

**عائیشە ئەوەندە لە ئیسلامدا گەورەیە ، هەتا وەك گوتمان زاتی خوا لە ئاسمانەوە ، هەروەها لە سورەتی (النور)ی نێو قورئانی پیرۆز خوا باسی پاکیی کردووە هەروەها پێغەمبەریش دەربارەی عائیشە دەفەرمووێ : نیوەی دینەکەتان لەو ئافرەتە سوورکەڵەیە "عائیشە" وەرگرن .**

**عائیشە ، کە ئەو پایە ئیمانیەی لای خوا و پێغەمبەر(ﷺ) هەبێ ، بەرەو ئەو ئاقارەمان دەبات کە دەمێك بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەبرێت کچێکی تەواو گەنج بێت نەك منداڵێك لە کۆڵان یاری بکات !**

**لەو ڕووانگەوە ، دەتوانین بڵێین : ئەو ئافرەتەی نیوەی دینی ئێمەی لا بێت ، لە ڕووی لۆژیك (منطق)ەوە نابێت منداڵێك بێت یاری منداڵانە بکات .**

**عائیشە و ڕای نووسەر ..**

**جارێ لەلای وەرگێرەوە ، عائیشە لە هەر تەمەنێك شووی بە پێغەمبەر(ﷺ) کردبێت باوەڕی وەرگێر ناگۆڕێت عائیشە هەر دایکی ئیمانی منە و بوخاری هەر تاجی سەرە .**

**ئەو ١٠ بەڵگە قورئانیی ، ئیمانیی ، مێژوویی ، لۆژیکییەی نووسەر لەسەر تەمەنی عائیشە هێناویەتیەوە وای لە وەرگێڕ کرد نووسینەکەی لە ئینگلیزیەوە وەربگێڕێت .**

**من بە هیچ جۆرێك باوەڕم بەو نووسەرانە نیە کە لە پێناو گومان و بەرژەوەندیەکی سیاسی یان ئابووری قسە لەسەر مەسەلەیەکی دینی دەکەن ، هیوادارم نووسەری ئەم دەقەش لە ڕوانگەی دڵسۆزیی بۆ ئیسلام ئەو کارەی کردبێت .**

دووباره و سێ بارەی دەکەمەوە ئەم نووسینە زۆر دوورە لە ڕشانەوەی هەندێ گومرا و سەرلێشێواو دەرهەق  بە عائیشە خان دەیڵێن .

ئەم نووسینە ، وەڵامێك نیە بۆ ئەو ڕشانەوانانە . بەڵكو ڕاستكردنەوەی مێژووی ئەو زاتەیە كە چەندەها فەرموودەی بە دروستیی لە پێغەمبەر(ﷺ) گێڕاوەتەوە و ڕەوتی ڕووداوە ئیمانیەكانی پێ ڕاستكراوەتەوە .

داواكارم لە خوای مەزن ئەم وەرگێرانەم بە توێشوی ڕێگا وەربگرێت ..

سەلام ناوخۆش بەكر

( تی ئۆ شەنەڤاز - T.O. Shanavas ) : نووسەری ئەم بابەتەیە ، فیزیاناسێكی ئەمریكی موسڵمانە ، دكتۆرە لە میشیگان .. بۆیەكەمجار ئەم نووسینە لە ئازاری ١٩٩٩ بڵاوكراوەتەوە .

## ئايا عائيشه بوكێكی شەش ساڵانە بوو ؟!

جارێك برادەرێكی فەلە(مەسیحی)م لێمی پرسی : كچە حەوت ساڵیەكەی خۆت دەدەیتە پیرەمێردێكی پەنجا ساڵی ؟ .. ئەوسا من بێدەنگ بووم ، ئەویش هەر بەردەوام بوو " ئەگەر بەمە رازی نابی ، ئەی چۆن بەوە رازی دەبی كە عائیشەیەكی حەوت ساڵان بدرێتە پێغەمبەرەكەت ؟ "

منیش وتم : ئێستا هیچ وەڵامێكم بۆ پرسیارەكەت پێ نییە ! .. برادەرەكەم كە ئەمەی گوێ لێ بوو زەردەخەنەیەكی بۆ كردم بەڵام درِكێكی لە دڵی باوەرِەكەم جێهێشت !

زۆربەی موسڵمانان ئەو جۆرە هاوسەرگیریەی ئەوسایان تەواو پێ قەبوڵە ئەگەرنا بەو هاوسەرگیریەی پێغەمبەر(ﷺ) و عائیشە رازی نەدەبوون ! ئەمە وەڵامی ئەو كەسانەیە كە ساویلكە و سادەن و هیچ ناخوێننەوە ، هەروەها هیچ لێكدانەوەیەكیان بۆ ئەو پرسیارانە پێ نیە ، هەرچی خۆم بووم ئەوا هەرگیز بەو وەڵامە قەناعەتم لا دروست نەبوو .

بێگومان پێغەمبەر(ﷺ) مرۆڤێكی تەواو جیاواز بوو نمونە بوو هەموو كردەوەكانی پاك و تەواون ئێمەی موسڵمان پەیرەویان دەكەین لاساییان دەكەینەوە ، وێرِای ئەمە زۆربەی ئەو خەڵكانەی لە مەڵبەندی ئیسلامی تۆلیدۆ ـ Toledo ـ ن لە نێویان من ، هەرگیز بیر لەوە ناكەنەوە كە كچێكی حەوت ساڵانەیان بدەنە پیاوێكی ٥٢ ساڵی ! ئەگەر باوكێك بەم جۆرە بەشودانە رازی بێ ئەوا زۆربەی خەڵك ئەگەر نەڵێم هەمووی بەچاوێكی كەم سەیری ئەو باوكە و مێردە پیرە دەكەن .

هەرچەندە من هیچ بەڵگەیەكی كۆنكرێتم نەبوو جگە لە رێزم بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش باوەرِم وابوو كە ئەو چیرۆكانەی لەبارەی ئەو هاوسەرگیریەی پێغەمبەر(ﷺ) و عائیشە هەن ، جگە لە كۆمەڵێ ئەفسانە هیچی تر نین .

گەرِانم بەدوای ئەم پرس و پرسیارەدا گومانەكەمی كردە یەقین ، پێغەمبەری من جێنتڵمانە ، هەرگیز كچێك ناهێنێت تەمەنی حەوت ساڵ بێت یان نۆ ساڵ ، لەو بەدواداچوونەم بۆم دەركەوت كە تەمەنی عائیشە بە (هەڵە) لە ئەدەبیاتی حەدیس

هاتووە ! لەمەش زیاتر ئەوانەی ئەم فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوە ، جێگای متمانە نەبوون ، ئەو هەموو کێشەیە لە گێڕانەوەی (هیشامی کوڕی ئورووە) سەری هەڵداوە !

لەم نووسینەدا هەوڵ دەدەم ئەو بەڵگانەی خوارەوە پێشکەش بکەم کە هەموویان تەواو ئەو گێڕانەوەیەی هیشامی کوڕی ئورووە هەڵدەوەشێننەوە ..

**بەڵگەکانی من :**

**بەڵگەی یەکەم :** زۆربەی ئەو گێڕاوانەی لە کتێبەکانی فەرموودە هاتوون ، ژێدەری باوەڕپێکراو ، یاخود سەرچاوەی متمانە و گومان هەڵنەگرن .

لە بارەی ئەو بابەتەوە کە لە (هیشام)ەوە ڕیوایەت کراوە ئەویش لە باوکیەوە وەریگرتووە ، پێش هەموو شتێ لەڕووی لۆژیك (منطق) و بنەماکانی فەرموودەناسیەوە دەبێ ڕووداوێکی ئاوها (دوو سێ) کەس ڕیوایەتی کردبێت نەك (تەنیا کەسێك) ، لە لێوردبوونەوەمان لەم مەسەلەیە بۆمان دەرکەوت کە تەنیا و تەنیا هیشام ئەو ڕیوایەتەی کردووە ، هیچ کەسێك لە (مەدینەی منەوەرە) هەتا هیشام خۆیشی تا لە مەدینە بووە ئەو فەرموودەیەی نەگێراوەتەوە ، قوتابیەکانی هیشامیش لەنێویاندا مالکی کوری ئەنەس فەرموودەی ئاوهای نەگێراوەتەوە ، بە شێوازێکی زنجیرەیی ڕاویەکانی ئەو فەرموودەیە هیچیان خەڵکی مەدینە نین بەڵکو سەرچاوەی ئەو چیرۆکە لە زاری عێراقیەکانەوەیە ، دوای ئەوەی هیشام مەدینە بەجێدەهێڵێت دەچێتە عێراق ، لە عێراقەوە ئەو چیرۆکە سەرهەڵدەدات نەك لە مەدینەوە .

کتێبی (تهذیب التهذیب) یەکێکە لە کتێبە متمانە پێکراوەکانی بواری فەرموودەناسی و لە ژیانی ڕاویەکانی فەرموودە دەدوێت ، ئەو کتێبە دەڵێت : بە گوێرەی (یاقیبی کوری شەیبا) هیشام یەکێکە لەو ڕاویانەی کە گێرانەوەکانی جێگای متمانەن وهەموو گێرانەوەکانی قەبوڵکراون تەنیا ئەو گێرانەوانەی نەبێت کە لەپاش ئەوەی چۆتە عێراق ڕیوایەتی کردوون !

(سەیری "تهذیب التهذیب" ابن حجر العسقلاني ، دار التراث الاسلامي ، سەدەی ١٥ ، بەرگی ١١ ، لا ٥٠ بکە)

**هەر لە هەمان لاپەرە هاتووە ، کە مالیکی کوڕی ئەنەس هەموو ئەو گێڕاوانەی هیشامی ڕەتکردۆتەوە کە لە ڕێگای عێراقیەکانەوە ڕیوایەت کراون .**

کتێبێکی تر لە بواری ژیاننامەی ڕاویەکانی فەرمووده ، کتێبی "میزان الاعتدال"ــە ، نووسەری ئەو کتێبە لەبارەی کەسایەتی هیشامەوە دەنووسێت : "کاتێك هیشام پیربوو زاکیرەی زۆرخراپ ببو" ... سەیری لاپەڕە (٣٠١)ی بەرگی چوارەمی ئەم کتێبە بکە .

لەمەدا ، دەگەینە ئەو ئەنجامە : هیشام لە پیریدا زاکیرەی (یادەوەری) خراپ بووە ، هەروەها ئەو کەسانەی کە لە عێراق فەرموودەیان لەو ڕیوایەت کردووە جێگای متمانە نەبوون ، بۆیە ئەو ڕیوایەتەی دەربارەی هاوسەرگیری عائیشە و تەمەنی عائیشە ڕیوایەتی کردووە ، جێگای متمانە نیە ، وێڕای ئەمەش کرۆنۆلۆژیا (تسلسل)ی ئەو ڕووداوانەی پەیوەندیدارن لە مێژووی ئیسلامەوە گرنگە بۆ زیاتر هەڵوەشاندنەوەی چیرۆکەکەی هیشام بن ئوروە :

- پێش ٦١٠ - سەردەمی جاهیلی – پێش دابەزینی سروش (وحی) .
- ٦١٠ یەکەم دابەزینی سروش .
- ٦١٠ ئەبوبەکر موسڵمان دەبێت .
- ٦١٣ پێغەمبەر(ﷺ) بە ئاشکرا بانگەوازی بۆ ئیسلام دەکات .
- ٦١٥ کۆچ بەرەو حەبەشە .
- ٦١٦ عومەری کوری خەتتاب موسڵمان دەبێت .
- ٦٢٠ مارەبرینی عائیشە بۆ پێغەمبەر (ﷺ)

| ٦٢٢ كۆچكردنی پیغەمبەر(ﷺ)بۆ مەدینە .

| ٦٢٤\٦٢٣ رازیــبوونی عائیشە ببێتە هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ).

## بەڵگەی دووەم : مارەبڕیــن

بە گوێرەی طبری (هەروەها هیشام بن ئوروە ، ئیبن حنبل و ئیبن سەعد) عائیشە لە تەمەنی حەوت ساڵی لە پێغەمبەر(ﷺ) مارەبڕاوە لە تەمەنی نۆ ساڵی گواستراوەتەوە !!

طبری ، لە كارێكی تر دەنووسێ : هەر چوار منداڵەكەی ئەبوبەكر لە هەردوو ژنەكەی لەسەردەمی پێش ئیسلام لە دایك بوون (لە سەردەمی جاهیلی) . بەرگی چوارەم ، لاپەرە ٥٠ی تاریخ الامم و المماليك ، دار الفكر ، بيروت ١٩٧٩ .

پرسیارەكە لێرەدا ئەوەیە ، ئەگەر عائیشە لە ساڵی ٦٢٠ (لە تەمەنی حەوت ساڵی) لە پێغەمبەر(ﷺ) مارەكرابێت و لە ساڵی ٦٢٤ (لە تەمەنی نۆ ساڵی) بووبێتە هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ) ، ئەوە دەبێت بە گوێرەی طبری هەر خۆی عائیشە لە ساڵی ٦١٣ لەدایك بووبێت ئەمەش هەڤدژە لەگەل ئەو ڕایەی طبری هەرخۆی كە دەڵێ : منداڵەكانی ئەبوبەكر لەسەردەمی جاهیلی لەدایك بووبن ؟! ئەو دوو ڕایە پێچەوانەیەی طبری یە ، جارێك زەواجی عائیشە بە ٩ ساڵ و جارێكی تر بەلای كەمی بە ١٤ دادەنێ ، كەواتە لەو ڕوانگەوە ڕای طبری لەسەر تەمەنی عائیشە جێگای متمانە نیە ناكرێ پشتی پێ ببەسترێ !

**بەڵگەی سێیەم : تەمەنی عائیشە بە بەراورد بە تەمەنی فاتیمە .**

ئیبن حەجەر لە (الاصابة فی تمییز الصحابة ، بەرگی چوارەم ، لاپەرە ٣٧٧) دەنووسێ : " فاتیمە لەسەردەمی دووبارە بونیاتنانەوەی کەعبە لەدایك بووە ، ئەوسا پێغەمبەر(ﷺ) ٣٥ ساڵ بوو .. فاتیمەش پێنج ساڵ لە عائیشە گەورەتر بووە . " بەگوێرەی ئەو ڕایەی ئیبن حەجەر ، کاتێك عائیشە لەدایك بووە کە تەمەنی پێغەمبەر(ﷺ) ٤٠ ساڵ بووە ، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) بۆتە ٥٢ ساڵ عائیشە تەمەنی ١٢ ساڵ بووە !

**بەڵگەی چوارەم : تەمەنی عائیشە بە بەراورد بە تەمەنی ئەسما .**

بەگوێرەی قسەی عبدالرحمن کوڕی ابی زناد : " ئەسما ١٠ ساڵ گەورەتر بووە لە عائیشە " بەرگی دووەم ، لاپەرە ٢٨٩ .

هەرچی ئیبن کەسیرە لەبەرگی ٨ی لاپەرە ٣٧١ی (البداية والنهاية) دەنووسێ : " ئەسما ١٠ ساڵ لە عائیشەی خوشکی گەورەتربووە " هەروەها ئیبن کەسیر دەنووسێ : ئەسما کوشتنی کورەکەی خۆی لە ساڵی ٧٣ی کۆچی بینیوە و پێنج ڕۆژ دوای ئەو ڕووداوە خۆیشی مردووە ، بەگوێرەی هەندێك گێرانەوەی تر (دە ، بیست ، بیست زیاتر ، ١٠٠ ڕۆژ) دوای ڕووداوی کوشتنی کورەکەی ، ئەسما خۆیشی مردووە ئەوساش تەمەنی سەد ساڵ بووە .

ئیبن حەجەر وەك ئیبن کەسیر دەنووسێ : ئەسما لە تەمەنی سەد ساڵی کۆچی دوایی کردووە ، ئەو ساڵەش ساڵی ٧٣ یان ٧٤ی کۆچی بووە .

تەماشای لاپەرە (٦٥٤)ی تقريب التهذيب بکە .

بەگوێرەی نزیکەی هەموو مێژوونووسان ، ئەسما ١٠ ساڵ لە عائیشە گەورەتر بووە ، ئەگەر ئەسما لە ساڵی ٧٣ی کۆچی تەمەنی ١٠٠ ساڵ بووبێت ئەوا دەبێت لەکاتی هیجرەت تەمەنی ٢٧ یان ٢٨ ساڵ بووبێت ئەمەش بەگوێرەی هەموو سەرچاوەکان کە ١٠ ساڵ لە عائیشە گەورەتر بووبێت ، ئەوا دەبێت عائیشە لەکاتی هیجرەت ١٧ یان ١٨ ساڵ بووبێت ، کەواتە کە عائیشە بۆتە هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ) ، تەمەنی ١٩ یان ٢٠ ساڵ بووە .

بەگوێرەی بەڵگەی چوارەم ، کە لەسەر ڕاکانی ئیبن حەجەر و ئیبن کەسیر و عبدالرحمن کوری ابی زناد بیناکراوە ، کاتێك عائیشە شووی بە پێغەمبەر(ﷺ) کردووە تەمەنی نۆزدە یان بیست ساڵ بووە .

ئەمەو ئیبن حەجەر لە بەڵگەی سێیەم تەمەنی عائیشە بە ١٢ ساڵ و لە بەڵگەی چوارەم تەمەنی عائیشە بە ١٧ یان ١٨ ساڵ دادەنێ ، ئەو هەڤدژی و ناکۆکیەی ئیبن حەجەر جێی متمانە نیە ، ئایا عائیشە ١٢ یان ١٨ ساڵ بووە ؟ کامەیان راستە ؟!

## بەڵگەی پێنجەم : شەڕی بەدر و ئوحد .

بەگوێرەی ڕیوایەتی موسلیم عائیشە لە شەڕی بەدر بەشداری کردووە ، هەروەها بەگوێرەی ڕیوایەتی بوخاری عائیشە لەگەڵ (ئوم سولەیم) بەشداری شەڕی ئوحدی کردووە .

لە (کتاب المغازی – باب الغزوات)ی بوخاریدا هاتووە : " ئیبن عومەر دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) ڕێی پێنەدام لە شەڕی ئوحد بەشداری بکەم ، چونکە ئەوسا تەمەنم ١٤ ساڵ بوو ، بەڵام لە شەڕی خەندەق کە تەمەنم ١٥ ساڵ بوو ، پێغەمبەر ڕێی پێدام کە لەو شەڕە بەشدار بم چونکە تەمەنم ١٥ ساڵ بوو " .

ئەمە لای پێغەمبەر(ﷺ) یاسا بوو ، ئەو کەسانەی تەمەنیان لەخوارەوەی پازدە ساڵی بوو نەیهێشتووە لە شەڕ بەشداری بکەن ، کەواتە تەمەنی پازدە ساڵی مەرج بووە بۆئەوەی هەرکەسێ بتوانێ بەشداری شەڕ بکات ، جا ئەمە ئەگەر بۆ کوڕ وابێت ، دەبێ بۆ کچ چۆن بێ ؟! ئەو بەشداریەی عائیشە لە (بەدر) و (ئوحد) تەواو ئەوە ساغ دەکاتەوە کە عائیشە تەمەنی لە سەرووی پازدە ساڵیەوە بووە ، ئەگەرنا پێغەمبەر(ﷺ) رێی پێنەدەدا بەشداری شەڕ بکات .

## بەڵگەی شەشەم : سورەتی الـقـمـر

دابەزینی سورەتی (القمر) بەڵگەیەکی ترە ، چیرۆکی نۆساڵەی تەمەنی عائیشە لەکاتی شوکردنی بە پێغەمبەر(ﷺ) هەڵدەوەشێنێتەوە .

بەگوێرەی دابێکی باوەرپێکراوی گشتی ، عائیشە هەشت ساڵ بەر لە هیجرەت لەدایك بووە ، بەڵام بەگوێرەی گێرانەوەیەکی تر کە لە بوخاریدا هاتووە " عائیشە دەڵێت : من کیژۆڵەیەکی گەنج (جارية) بووم کە سورەتی القمر(مانگ) دابەزی ، ئەو سورەتەی قورئان کە هەشت ساڵ پێش هیجرەت دابەزیوە .

جا ئەگەر ئەو بانگەشەیەی دەکرێت کە عائیشە لە ٦٢٣ یان ٦٢٤ تەمەنی نۆ ساڵ بوو بێت و شوی بە پێغەمبەر(ﷺ) کردبێت ، ئەوا دەبێ لەسەردەمی دابەزینی سورەتی القمر عائیشە زارۆك - سەبیلۆکە - صبية بووبێ نەك (جارية) !

کە ئەمەش پێچەوانەی مێژووی دابەزینی قورئانە .

بە گوێرەی ڕووداوی دابەزینی سورەتی القمر عائیشە گەنجێکی چالاك بووە ، چونکە وشەی (جارية) لە زمانی عەرەبیدا بە کچێك دەوترێ کە تەمەنی لە نێوان ٦ بۆ ١٣ ساڵ بێت ، ئەم لێکدانەوە ماتماتیکیەش دەکرێت بەم هاوکێشەیە چارەسەر بکەین :

کاتی دابەزینی سورەتەکە ٨ ساڵ پێش کۆچکردنە .

تەمەنی عائیشە ئەوسا ٦-١٣ ساڵ بووە .

تەمەنی عائیشە لەکاتی کۆچکردن ١٤-٢١ ساڵ بووە .

تەمەنی عائیشە لەکاتی شوکردنی بە پێغەمبەر ١٥-٢٢ ساڵ بووە .

٨ : پێش کۆچ

٦-١٣ : لێکدانەوەی واتای جاریە .

١ : کۆچی

تەمەنی عائیشە :

کەمترین تەمەن ١٥ ساڵ ، زۆرترین تەمەن ٢٢ ساڵ ، تەمەنی تەقریبی ١٩ ساڵ .

## بەڵگەی حەوتەم : زاراوەسازیی (تەرمینۆلۆژی) عەرەبی .

بەگوێرەی گێرانەوەیەك ، کە لە موسنەدی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل هاتووە ، دوای مردنی خەدیجە یەکەم هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ) ، خەولەخان هاتۆتەلای پێغەمبەر(ﷺ) ، داوای لێکردووە کە جارێکی تر ژن بهێنێتەوە ، لە وەڵامدا پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووە : هیچ کەسێکت لە خەیاڵدایە ؟ خەولەش پێی وتوە : دەتەوێت کچ (بکر) بێنیت یان بێوەژن (ثیب) ؟ کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) پێی دەفەرمووێ : کچ ، خەولەش دەڵێت : کە کچێکی لەخەیاڵدایە بۆی ، خەولە ناوی عائیشەی هێناوە .

ئەوانەی شارەزای زمانی عەرەبین چاك دەزانن وشەی (بكر) لە زمانی عەرەبی بۆ كچێكی نابالْغی تەمەن نۆساڵە بەكارنایەت ، بەڵكو بۆ كچی بالْغ " بالْەق بوو – خۆناسیو " بەكاردێت .. عەرەب وشەی (جارية)ی هەیە ، وشەی "بكر" لە زمانی عەرەبیدا بۆ ئەو كچە بەكاردێت كە شوی نەكردبێت ، هەروەها ئەزموونی جنسیی (سكێسیی) پێش زەواجكردنی نەدیتبێت ، لەم ڕوانگەوە بە ڕاشكاوی دەتوانین بڵێین :

كە خەولەخان چاك دەیزانی عائیشە كاتی شوكردنی هاتووە ، بۆیە بۆ پێغەمبەری دیاری كردووە ، هەروەها لە ڕووی زمانەوەش بەهیچ جۆرێك وشەی (بكر) بۆ كچێكی تەمەن نۆساڵە بەكارنایەت .

سەیری موسنەدی ئەحمەدی كوڕی حەنبەل ، بەرگی شەشەم ، لاپەرە ١٢٠، چاپی (دار احياء التراث العربی) بكە .

لەم گێرانەوەیەش دەردەكەوێت ، كە عائیشە نەك لەكاتی زەواجكردن بەڵكو لەكاتی دیاریكردن و مارەبڕینیش لە ڕووی سێكسیەوە تەواو خۆی ناسیوە ، بۆیەش خەولەی دۆستی خەدیجە ، عائیشەی بۆ پێغەمبەر دیاری كردووە .

بەڵگەی هەشتەم : دەقەكانی قورئان .

هەموو موسڵمانەكان ئەو ڕاستیەیان تەواو قەبوڵە كە قورئان ڕابەرنامەیە ، ئاراستەنامەیە ، لەبارەی مەسەلەی تەمەن و زەواجی عائیشەش با لە دەقەكانی قورئان بگەڕێین بۆئەوەی ئەو "تارمایی" و "دوكەڵ" و "لیڵی" و " سەرلێتێكچوونانە " لابەرین كە هەندێك لە پیاوە ناودار و دیارەكانی سەردەمی كلاسیكی ئیسلام ، لە دیاریكردنی تەمەن و زەواجی عائیشە خوڵقاندویانە ! با بپرسین ، ئاخۆ قورئان ڕێ دەدا یا ڕێ نادا بە پرۆسەی هاوسەرگیری كچێكی خۆنەناسیوی تەمەن حەوت ساڵە ؟

**لەقورئاندا هیچ دەقێك نیە ، بەڕاشكاوی ڕێ بەو جۆرە زەواجە بدات .**

**ئایەتێك لە قورئاندا هەیە كە گوتارەكەی ئاراستەی موسڵمانانە بۆئەوەی هەتیوان بەخێوبكەن ، ئەو دەقەش لە سورەتی (النساء ٥-٦) هاتووە "ماڵی خۆتان مەدەنە دەست كەم عەقڵان ، بەڵام جل و بژێویان لە ماڵی خۆتان بۆ دابین بكەن و بە ڕووی خۆشەوە بیاندوێنن ، هەتیوان تاقی بكەنەوە تا دەبنە گەنجی ڕەشیدە(تا خۆیان دەناسن) ، جا ئەگەر دیتان خاس و خراپ لەیەكتر جیا دەكەنەوە ، ئەوسا ماڵیان بدەنەوە . "**

**بەگوێرەی ئەو دەقەی قورئان مرۆڤی موسڵمان ئەم ئەركانەی خوارەوەی بەرامبەر هەتیو لە ئەستۆدایە :**

**١ـ نانیان بدات ، بژێوییان بۆ دابین بكات .**

**٢ـ جل و بەرگیان بۆ پەیدا بكات .**

**٣ـ دایاننێتە بەر خوێندن و پەروەردەیان بكات .**

**٤ـ تاقییان بكاتەوە ، ئاخۆ لەڕووی عەقل و جنسەوە پێگەیشتوون ، ئەگەر ئەم دووەیان هەبوو ئەوا ئەم هەتیوانە لە خەم دەردەچن و خۆیان دەبنە بەرپرسی ژیانی خۆیان .**

**وەك لە مەرجی چوارەمدا دەردەكەوێت كە ئەو دەقەی قورئان جەخت لەسەر پێگەیشتنی عەقلی و سێكسی هەتیو دەكات بۆئەوەی ماڵ و موڵكی خۆیان بۆخۆیان بكاربێنن .**

**سەبارەت بە كارەكەی ئێمەوە ئەوەیە ، ئەو كەسەی لەڕووی سێكسیەوە خۆی نەناسێت " باڵق نەبێ - عادەبوونی نەبینێ " شایانی ئەوەی نابێ كە زەواج بكات ، چونكە خودی زەواجیش پەیوەستە بە پێگەیشتنی عەقڵیەوە .**

لەبەر ڕۆشنایی ئەو دوو ئایەتەی سورەتی (النساء)دا هیچ موسڵمانێکی خاوەن عەقڵ ئیدارەی کاروباری دارایی ناداتە دەست کچێکی خۆنەناسیوی تەمەن حەوت ساڵە ، چونکە ئەمە لەگەڵ قورئان تێکناکاتەوە !

**جا ئەگەر ئێمە متمانە بە کچێکی تەمەن حەوت ساڵە لە بەڕێوەبردنی کاروباری دارایی نەکەین بێگومان ئەو کچە لەڕووی عەقڵی و جەستەییەوەش ، ناگونجێ زەواج بکات .**

وەك پێشتر وتمان ئەو لیڵی و تارماییە دەربارەی تەمەن و زەواجی عائیشە لە دەمی هەندێك زانای موسڵمانەوە هاتووە ، ئەوەتا ئەحمەدی کوری حەنبەل لە موسنەدەکەی ، بەرگی شەشەم ، لاپەرە٣٣ و لاپەرە ٩٩ "بانگەشەی" ئەوە دەکات کە "عائیشە تەمەن نۆساڵی ئەوەندە مژۆڵی بوکانێ (یاریکردن بە ئەسپی یاری) بووە ، ئەوەندە ئەرکی خۆی وەك ژنێك پێ نەدەکرا " .

بەڕاستی دژوارە مرۆڤ باوەڕ بەو دەقە بکات ، ئەمەش لەبەر دوو هۆ :

هۆی یەکەم : ئەبوبەکری گەورە برواداری ناو موسڵمانان ، ڕازی بێت کچێکی حەوت ساڵانەی خۆی ، کە هێشتا خەریکی وازی و بوکانێ بێت ، بە پیاوێکی تەمەن ٥٠ ساڵی بدات !

هۆی دووەم : بەهەمان دژواریی ، بەڵکو زیاتریش مرۆڤ ناتوانێت خەیاڵی ئەوە بکات یان هەرگیز ئەوەی بە خەیاڵ دابێت کە کەسێکی وەك پێغەمبەر(ﷺ) کچێکی تەمەن حەوت ساڵانە بێنێ !

ئەرکێکی تری گرنگ ، بەگوێرەی دەقە قورئانییەکە لە ئەستۆ بگرین ، کاری بەخێوکەر " فێرکردنی هەتیو و بەخێوکردنیەتی"

با ئەم پرسیارە لەخۆمان بکەین : چەند کەس لە ئێمە باوەڕی وایە کە دەتوانین منداڵەکانمان بەتەواوی و بەدروستی پەروەردە بکەین ، پێش ئەوەی دەگەنە تەمەنی حەوت ساڵی یان نۆ ساڵی ؟ بێگومان وەڵامەکە "کەس" مان نابێت ، لەڕووی لۆژیکیەوە

**بەراستی ئەركێكی دژوارە كە منداڵێكی حەوت ساڵانە بەشێوەیەكی پڕ ڕەزامەندیی پەروەردە بكەین ، لەم ڕوانگەوە چۆن دەتوانین باوەڕ بەوە بكەین كە عائیشە لە تەمەنی حەوت ساڵیەوە " كە لە نەزەر هەندێ كەسەوە تەمەنی بە شودانی بووە " تەواو پێگەیشتووە و تەواو ڕۆشنبیری سێكسی وەرگرتووە ؟!**

**ئەبوبەكر لە هەمووومان دادوەرتر بووە ، بۆیە ئەو بەتەواوی لەبەرامبەر كچەكەشی هەروا بووە و زانیویەتی كە عائیشە لە تەمەنی حەوت ساڵیدا منداڵ بووە و بەگوێرەی قورئان ئەو منداڵە لەو تەمەنەدا تەواو ڕەشیدە نەبووە تاكو چاك و خراپ لەیەك جیابكاتەوە ، بۆیە هەرگیز ڕازی نەبووە كچەكەی لەو تەمەنە بە هیچ كەسێك بدات ، ئەگەر پێشنیاری داخوازی (داواكردنی) كچێكی خۆنەناسیو لەڕووی سێكسەوە یان هەتا بڵێی كچێكی حەوت ساڵانەی پەروەردەكراوی وەك عائیشە هاتبوایە لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەوا پێغەمبەر دەستبەجێ ئەو پێشنیاز و داخوازیەی ڕەتدەكردەوە ، چونكە نە پێغەمبەر و نە ئەبوبەكر ناتوانن پێشێلی هیچ پەرەگرافێكی یاخود بەندێكی قورئانی پیرۆز بكەن .**

**لەم بەڵگەیەش دەگەینە ئەم ئەنجامە :**

**بانگەشەی زەواجی عائیشە لە تەمەنی حەوت ساڵیدا ، خۆی لەخۆیدا پێشێلكردنی پێویستی و مەرجەكانی پێگەییوی(خۆناسینی سێكسی) لە قورئان دەگەیەنێ ، چونكە بەپێی قورئان كچ هەتا نەگاتە قۆناغی خۆناسین ، لەڕووی لۆژیك و عەقڵ و جەستەوە ، ئامادەگی زەواجی تێدانیە ، لەم پێودانگەوەش ، ئەو بانگەشەیەی كە لە هەندێ كتێبی كۆنەوە دەرهەق بە زەواجی عائیشەیەكی خۆنەناسیو كراوە ، جگە لە ئەفسانە هیچی تر نیە .**

## بەڵگەی نۆیەم : ڕازی بوون لە هاوسەرگیرییدا .

لە ئیسلامدا ، ئافرەت دەبێ ڕاوێژی پێ بکرێت و ڕای وەربگیرێ ، ئەویش ڕازی بێت بۆئەوەی هاوسەرگیریەکە شەرعی بێت .

(مشكاة المصابيح ، بەرگی یەکەم ، لاپەرە ٦٦٥)

لەڕووی بنەماکانی ئیسلامەوە (ڕێ پێدانی متمانە پێکراوی ئافرەتان - ئازادی پێدان بۆ گوزارشت کردن لە ڕای خۆیان) مەرج و پێداویستیەکی زەروریە ، بۆئەوەی هاوسەرگیریەکە شەرعی بێت ، بەهیچ جۆرێ خەیاڵ ناکرێ ئەو ڕێپێدانەی کچێکی خۆنەناسیوی تەمەن حەوت ساڵانە دەیدات دەسەڵاتێکی شەرعی بێ بۆ هاوسەرگیری .

هێندە نالۆژیکیە ، کە باوەڕ بکرێ ئەبوبەکرێکی ڕووناکبیر ، ڕوخسەتی کچێکی حەوت ساڵانە بدات ، شوو بە پیاوێکی پەنجا ساڵی بکات ، بەهەمان شێوە هەرگیز پێغەمبەر(ﷺ) ڕوخسەتی کچێکی حەوت ساڵانە وەرناگرێ ، کە بە قسەی موسلیم ئەوەندە بچووك بووە کە یاریەکانی لەگەڵ خۆی بۆ ماڵی پێغەمبەر(ﷺ) بردبێت ، چ لۆژیکێك ئەوە قەبوڵ دەکات کە پێغەمبەر(ﷺ) کچێك بێنێ ، شەوی بوکێنی یاریەکانی لەگەڵ خۆی ببات ؟

نەدەبوو موسلیم بەهیچ جۆرێك ئەو (ئەفسانەیە) ! لەنێو کتێبەکەی دابنێت !

لەم بەڵگەیە دەردەکەویت ، کە پێغەمبەر(ﷺ) کچێکی حەوت ساڵانەی نەهێناوە چونکە ئەو دەیزانی ئەمە پێشێل کردنی بنەماکانی هاوسەرگیریی ئیسلامییە ، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) عائیشەیەکی ژیر و خاوەن ئاوەز(عقل) و خۆناسیوی هێناوە و گێرانەوەی دروست ئەمەیە ، هەرچیەکی تر لە هەرکوێ هاتبێ ، جگە لە ئەفسانە هیچی تر نییە !

**کورتەی توێژینەوەکە :**

**نە لە کلتوری عەرەبدا هەبووە کچێکی حەوت ساڵی یان نۆ ساڵی بدەنە شوو ، نە پێغەمبەریش لەو تەمەنە عائیشەی هێناوە ، عەرەبی جەزیرە دژی ئەو هاوسەرگیریە نەبوون چونکە بەهیچ جۆرێك هاوسەرگیریی ئاوا وەك لە گێڕانەوەکاندا هاتووە ، لە ئەرزی واقیعدا ڕووی نەداوە .**

گێڕانەوەی هیشامی کوڕی ئوروە ، سەبارەت بە شوکردنی عائیشە لە تەمەنی نۆ ساڵیدا ، بەهیچ جۆرێك بە ڕاست دانانرێت ، چونکە چەندەها گێڕانەوەی تر هەن ، تەواو هەڤدژن(پێچەوانەن) لەگەڵ گێڕانەوەکەی ئەو ، وێڕای ئەمەش ، هیچ لۆژیکێك لەوەدا نیە کە ئەو گێڕانەوەیەی هیشام بە دروست وەربگیرێت ، چونکە زانایان لە نێویاندا مالکی کوڕی ئەنەس ئەو گێڕانەوەی هیشامی بەبێ بنەما و بێ متمانە داناوە ،

هەروەها هۆی ئەو ڕایەش ئەوەیە هیشام کە ئەو گێڕانەوەیەی کردووە لە عێراق بووە ، زاکیرەی لاواز بووە و ئەوانەی لەویشیان گێڕاوەتەوە جێگای متمانە نەبوون !

ئەو قسانەی لە کتێبەکانی طبری و بوخاری و موسلیم سەبارەت بە تەمەنی عائیشە هاتوون ، لەگەڵ یەك ناکۆکن و یەکتر هەڵدەوەشێننەوە ، بۆیە لەو بابەتەوە زانستی نین ، لەمەش زیاتر ، زۆرێك لەو زانایانە هەتا لە نووسینەکانی خۆیان ڕای پێچەوانەی یەکتریان تۆمارکردووە .

لەم پێودانگەوە ، بەڕاشکاوی دەڵێین : گێڕانەوەی تەمەنی عائیشە لەکاتی شوکردنی بە پێغەمبەر(ﷺ) جێگای متمانە نیە چونکە لەو نووسینانە هەڤدژیەکی ڕوون هەیە .

**له ئەنجامدا ، هیچ هۆیەك نیە بۆئەوەی باوەڕ بەو زانیاریانەی تەمەنی عائیشە بکەین ،**

**چونکە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە ، دەرفەتی تەواو هەیە ئەو جۆرە "قسانە" ڕەد بکەینەوە و هەتا بە ئەفسانەی دابنێین ، وێڕای ئەمەش قورئانی پیرۆز بەڕاشکاوی زەواجی کچی خۆنەناسیو و کوڕی نابالغ ڕەتدەکاتەوە ، هەروەها بەرپرسیارێتیشیان پێ ناسپێرێت .**

وصلى الله وسلم وبارك على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين